


# گەر دەتانەوێ شوێن ڕێبازێك كەون ئەوە شوێن ڕێبازی مردووەكان كەون

نوسینی: ئەبو ئەنەسی تەوحیدی

# گەر دەتانەوێ شوێن ڕێبازێك كەون
# ئەوە شوێن ڕێبازی مردووەكان كەون

نوسینی: ئەبو ئەنەسی تەوحیدی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

ناونیشانی ئەم پەرتووکە لە وتەیەکی ئیبن مەسعود و ئیبن عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ)وەرگیراوە، کە دەفەرموون:هەرکەسێك لە ئێوە ئەگەر دەیەوێ شوێن ڕێگە و ڕێبازێك بکەوێ، ئەوە با شوێن ڕێبازی ئەو کەسانە بکەوێ کە مردوون-مەبەستیان سەلەفی صاڵحە-،چونکە زیندووەکان لێیان ئەمین نابین.دواتریش بەدرێژی باسی ئەو ئەثەرە دەکەین إن شاء الله .

کەشتی ڕزگاربوون لە دونیا و دوارِۆژدا بریتییە لە شوێنکەوتنی ڕێبازی سەلەفی صالّح لە هەموو بوارەکانی: ئیمان و بیروباوەڕ و،خواپەرستی و،خورەوشت و، پەروەردە و تەزکییە و، زانست و تێگەیشتن و، وتە و، کردەوەدا .

کەس لەموسڵمانان گومانی لەوەدا نییە کە شوێنکەوتنی قورئان و فەرموودەی صەحیح واجبە، بەڵام کەمن ئەوانەی دەڵێن:ئەو قورئان و فەرموودەیە بەتەنها بەس نییە،بەڵکو دەبێ بەپێی تێگەیشتنی پێشینە چاکەکان بێت !!!

بۆیە هەرکەسێك ئەگەر ڕاست بكات لە بانگەشەی شوێنکەوتنی کیتاب وسوننە، ئەوە پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی سەلەف،چونکە ناکرێ بڵێ من شوێن کیتاب وسوننە دەکەوم بەڵام بە پێی تێگەیشتنی خۆم، یا مامۆستاکەم،یاخود هەرکەسێکی تر .

وە هەر نەگەڕانەوەیە بۆ کیتاب وسوننە بە پێی تێگەیشتنی سەلەف، بوویتە هۆی پارچە پارچە بوونی موسڵمانان بۆ چەندان حیزب وگرووپ .

وە دەست گرتن بە ڕێبازی سەلەف موسڵمان دەپارێزی لە لاڕێبوون و گومڕایی لە دونیادا، وە لە ئاگری دۆزەخیش لە دوارِۆژدا .

وە هەروەها ئەگەر موسڵمانان بیانەوێ حاڵ و وەزعیان چاك ببێ،ئەوە هەر دەبێ بگەڕێنەوە بۆسەر ڕێبازی سەلەف.

وەکو ئیمامی مالیك(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: (لن يصلح آخر هذه الأمة إلا بما صلح به أولها) . واتە:کۆتایی ئەو ئومەتە چاك نابێ، تەنها بەو شتە نەبێ کە سەرەتاکەی پێی چاك بوو .

وە هەرکەسێکیش شوێن هەر ڕێبازێك کەوێ، جگە لە ڕێبازی سەلەف، ئەوە گومڕا دەبێ و، لەڕێگە ڕاستەکە دەردەچێ .

وەکو عبد الله کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (بەردەوام خەڵکی لەسەر ڕێگای ڕاستن، هەتا ئەو کاتەی شوێن ئەثەر بکەون) .

وە ئیمامی مالیکیش(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ:(سوننەت وەکو کەشتیەکەی نوح وایە،هەرکەسێك سواری ببێ ئەوە ڕزگاری دەبێ،وە هەرکەسێکیش لێی بەپاش کەوێ و سواری نەبێ ئەو نوقم دەبێ) .

لەبەر ئەم خاڵانە پێم باش بوو باسێك ئامادە بکەم دەربارەی مەنهەجی سەلەفییەت و،واجبیەتی شوێنکەوتنی مەنهەجی سەلەف .

کاری منیش لە ئامادەکردنی ئەو باسەدا، تەنها کۆکردنەوە و، ڕێخستن و، وەرگێڕانە، جگە لەچەند وشە و ڕستەیەك نەبێ .

## بەشی یەکەم

ڕوونکردنەوەی زاراوەکان لەم بەشەدا دێینە سەر ڕوونکردنەوەی هەریەك لە زاراوەی: سەلەف و، سەلەفی و، سەلەفییەت .

١ -واتای وشەی سەلەف (السلف): لە زمانەوانیدا: ئیبن فارس(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: سلف، سین و لام فاء بنچینەیەکە بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتن، السلف واتە:ئەوانەی ڕۆیشتوون، وە القوم السلاف واتا: پێشکەوتووەکان .

ئیبن منظور(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ:السلف واتە:ئەوکەسەی پێش تۆ کەوتووە لەباب و باپیرانت و خزمە نزیکەکانت،ئەوانەی لەسەروو تۆنە لە پێشکەوتن و چاکەدا .

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (عفا الله عَما سلف ومَن عاد فينْتقم الله مِنه).
واتە: خوا خۆش بووە لەوەی کە تێپەڕی و بەسەرچوو، بەڵام هەرکەسێك بگەڕێتەوە (بۆسەر ئەو کردەوەیە) ئەوا خوا تۆڵەی بەتینی لێدەسێنێ .

وە دەفەرمووێ: (وجعلناهم سلفا ومثلا للآخرين). واتە:کردمانن بە پێشینەو، پەند و عیبرەت بۆ خەڵکانی پاش خۆیان .

وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە فاتیمەی کچی (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموو: (فإنه نعم السلف أنا لك). واتە:بەڕاستی باشترین پێشینەیەك بۆ تۆ منم .

وە ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرمووێ: سلف واتە: پێشکەوتوو، واتای فەرموودەکەش:من پێش تۆ کەوتووم و لە پێش تۆ ڕۆیشتووم، پاشان تۆش دێیە لای من .

کەواتە وشەی(سلف)لە مانەوانیدا واتە: پێشینە .

بەڵام لەزاراوەدا(واتە:زاراوەی زانایانی بیروباوەڕ): سەلەف بریتییە لە: هاوەڵەکان (الصحابة)و،شوێنکەوتووەکان (التابعين) و،شوێنکەوتووی شوێنکەوتووەکان (تابعي تابعين)، واتە: خەڵکی سێ سەدە چاکەکە. بێگومان سەلەف بریتییە لەخەڵکی سەدە چاکەکان (هاوەڵان و شوێنکەوتووەکان وشوێنکەوتووی شوێنکەوتووەکان)،جا هەرکەسێك بەدوای ئەواندا بڕوا و لەسەر ڕێبازی ئەوان بڕوات، ئەوە کەسێکی(سەلەفییە)، وە هەرکەسێکیش شوێن ئەوان نەکەوێ، ئەوە کەسێکی خەلەفییە.

کەواتە مەبەست بە وشەی سەلەف لەڕووی مێژوو و سەدەوە، خەڵکی سێ سەدە باش و شایەتی بۆ دراوەکە دەگرێتەوە، لە(صەحابە و تابعين و تابعی تابعين)ەکان .

بەڵام لەبەر ئەوەی لەو سێ سەدەیەدا خەڵکی باش و خراپ ژیاوون، زانایان قەیدی (صاڵح) یان بۆ داناوە و،کردویانە بە(السلف الصالح)واتە: پێشینە چاکەکان، بۆ ئەوەی خەڵکی خراپ بێتە دەرەوە، وە کاتێکیش کە دەوترێ:

ڕێبازی پێشین(مذهب السلف)،ئەوە مەبەست پێی ئەو ئیسلامەیە کە پێشینە چاکەکان لەسەری بووینە .

٢- بەڵام وشەی سەلەفی(السلفي): ئەو(ياء)ەی کە بەوشەی(سەلەف)ەوە نووساوە،یائی خستنە پاڵە(نسبة)واتە:ئەو کەسەی خۆی دەداتە پاڵ ڕێبازی سەلەف، هەروەکو چۆن ئەگەر کەسێك لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بێت، پێی دەوترێت: حەنبەلی، ئینجا ئەو نسبەتە(واتە خۆدانە پاڵ ڕێبازی سەلەف)نیسبەتێکی گەورەو پیرۆزە جێگای فەخر و شانازییە، چونکە نیسبەتە بۆ ڕێبازێکی پارێزرا و لەهەڵە-بەشێوەیەکی گشتی- کەواتە سەلەفی: ئەو کەسەیە کە لەسەر ڕێبازی پێشینە چاکەکان دەڕوات، لە هەموو بوارەکانی بیروباوەڕ و،خواپەرستی و،خورەوشتدا .

ئیمامی ذەهەبی(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ:السلفي: وهو من كان على مذهب السلف. واتە: سەلەفی:ئەو کەسەیە کە لەسەر ڕێبازی سەلەف بێت . کەواتە هەرکەسێك پەیوەست بێت بە بیروباوەڕ و تێگەیشتنی پێشینە چاکەکان،ئەوە کەسێکی(سەلەفی)یە،هەرچەندە دووریش بێت لەوان لە ڕووی شوێن و سەردەمەوە،بەڵام ئەو کەسەی لەسەر ڕێبازی سەلەف نەڕوا، ئەوە لەوان نییە، ئەگەرچی لەناویشیان ژیابێ .

* لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە:ئایە دروستە موسڵمان بەخۆی بڵێ سەلەفی؟

وەڵام: بەڵێ دروستە بە مەرجێك ڕاست بکات لە بانگەشەکەی،وە بەگوێرەی توانا هەوڵبدات لەسەر ڕێبازی سەلەف بڕوات .

واتە بەس ناو نەبێت،بەخۆی بڵێ سەلەفی، بەبێ ئەوەی لە ڕووی بیروباوەڕ و کردەوەدا لەسەر ڕێبازی سەلەف بێت، ناو لەخۆنان بە سەلەفی هیچ کاریگەریەکی نییە، ئەگەر موافیقی ناوەڕۆکەکە نەبێت، بەڵکو ئەو کاتی بانگەشەیەکی درۆیە و،نیفاقە،چونکە سەلەفییەت ناو نییە بەتەنها، بەڵکو حەقیقەت و ناوەڕۆکە، پەیوەست بوونێکی ڕاست و دروست و ڕاستگۆیانەیە بە ڕێبازی سەلەف .

بۆیەش ئەمڕۆ زۆرن ئەوانەی بانگەشەی سەلەفییەت دەکەن، وەکو(مورجیئەکانی سەردەم..مەدخەلییەکان و حەمدانیەکان)، بەڵام کە سەیری بیروباوەڕ و کردەوە و ئەخلاقیان دەکەی، زۆر دوورن، ئەوان لە دۆڵێکن و، سەلەفی سالح لە دۆڵێکی ترن .!!!

كل يدعي وصلا بليلى وليلى لا تقر لهم بذاك

جا ئەگەر کەسێك بپرسێ:بۆچی ناو لە خۆمان بنێین سەلەفی؟بۆچی ناوێکی تر دابێنین؟ ئایا ناوی موسڵمان بەس نییە؟

وەڵام: بەکارهێنانی هەر ناو و زاراوەیەك کە بەڵگە بێت لەسەر ڕاستییەك، دروستە و هیچی تێدا نییە،مادام بۆ مەبەستێکی خراپ نەبێت .

ئینجا ئەو هۆکارەی وایکرد ئەو ناوە بەکاربهێنرێ، بریتیی بوو لەو بیدعە و گومڕایی و کۆمەڵە گومڕایانەی کە پەیدا بوون،هەریەکەیان ناوێکی هەبوو پێی دەناسرانەوە، لەهەمان کاتیش بەخۆیان دەووت موسڵمان،وەکو: شیعە و، خەواریج و، مورجیئە و، موعتەزیلە و، جەهەمییە و، حەمدانی و قەدەرییەو، سۆفی و ئەشعەریی و.....هتد،ئەمە وایکرد ئەهلی حەق چەند ناوێکیان هەبێ-بۆ جیابوونەوە لە کۆمەڵە گومڕاکان-وەکو:ئەهلی سوننە، ئەهلی ئەثەر، سەلەفی...هتد .

کەواتە ناوی سەلەفی ناوێك نییە لە جیاتی وشەی موسڵمان بەکاربێت،بەڵکو ئەوە موسڵمانە ڕاستەقینەکەیە کە پێی دەوترێت سەلەفی،بۆ جیابوونەوە لە کۆمەڵە گومڕاکان .

وە ئەوانەی نکوڵی لەبەکارهێنانی ئەو ناوە دەکەن، خۆیان ناوی تایبەتییان هەیە،کە بۆخۆیان بەکاریدێنن بۆ جیابوونەوە لە غەیری خۆیان ،جا ناوی حیزبێك بێت یا فیکرەیەك یا هەر ناوێکی تر .

کەواتە چۆن بۆ خۆتان پێتان ڕەوایە ناوی تایبەتیتان هەبێ،ئاواش بۆ غەیری خۆتان پێتان ڕەوا بێت !!!

شێخ ئەبو بەصیریش(خوا بیپارێزێ)دەفەرمووێ: وشەی سەلەفییەت و سەلەفییەکان، ئەگەر مەبەست پێی گەڕانەوە بێت بۆ کیتاب و سوننە، بەگوێرەی تێگەیشتنی سەلەف لەهاوەڵان و، شوێنکەوتووەکانیان بە چاکە...وە

مەبەست پێی سیفەتی ئەو کەسە بێت کە لەسەر ئەو ڕێبازەیە...ئەوە ئەو کاتە وشەیەکی سوپاسکراوە،تێیدەگەین و بەدروستی دەزانین...وە پێمان وایە هیچی تێدا نییە گەر بەکاربهێنرێ... بەڵام ئەگەر مەبەست پێی حیزبایەتی و، دەمارگیری بێت بۆ هەندێ کەسی ئەو سەردەمە، وە بۆ پارچە پارچەکردنی ئومەت بێت بۆ چەندان حیزب و کۆمەڵ کە (ما أنزل الله بها من سلطان)...وە لە هەندێ کاتدا بەکاربهێنرێ بۆ کەسێك کە مەیل و ئارەزووی بەلای تاغووتە ستەمکارەکاندا هەیە..خۆشەویستی و دۆستایەتی هەیە بۆیان..ئەو کاتی ڕەتی دەکەینەوە و خۆمان دەپارێزین لە بەکارهێنانی .

زانایانیش هەر لە کۆنەوە تا ئەو سەردەمە وشەی(سەلەفی)یان بەکارهێناوە بۆ کەسێك لەسەر ڕێبازی سەلەفی صاڵح بێت، وەکو :

١-ئیمامی زەهەبی دەفەرمووێ:(ئەوەی پێویستە بۆ کەسی(حافظ)، ئەوەیە دەبێ تەقوادار و، زیرەك و،نەحو زان و،زمان زان و، بەشەرم و، سەلەفی بێت،...) .

٢ -ئیمامی زەهەبی دەربارەی دارا قطنی دەفەرمووێ: ئەو پیاوە هەرگیز نەچۆتە ناو زانستی کەلام و جیدالەوە، وە ڕۆش نەچووە تێیدا،بەڵکو کەسێکی سەلەفی بووە(بل كان سلفيا) .

٣ -وە دەربارەی محمدی بەهرانی دەفەرمووێ:کەسێکی دیندار و،چاکەکار و، سەلەفی(سلفيا)و بەڕێز بووە.

٤- وە دەربارەی یەحیای شەیبانی دەفەرمووێ:کەسێکی شارەزابوو بە مەزهەبەکان، چاکەکار و خۆبەکەمزان و سەلەفی بوو .

٥ -وە دەربارەی ئیبن هبیرە دەفەرمووێ:کەسێك بوو شارەزایی هەبوو لە مەزهەبەکان و زمانی عەڕەبی و تەرازووی هۆنراوە(عروض)، سەلەفی و ئەسەریش بووە(سلفیا أثریا) .

٦ -وە هەروەها وەکیعیش دەربارەی ئیسماعیلی کوڕی حەماد دەفەرمووێ: سەلەفییەکی ڕاست و دروست بوو .

کەواتە بەکارهێنانی ئەم وشەیە دروستە-نەك واجب یاسوننەت بێ-بەو شێوەیەی کە باسمان کرد، چونکە ناوێکی کورتکراوەیە، لە جیاتی ئەوەی بڵێی من موسڵمانێکم شوێنکەوتووی قورئان وفەرموودەم بەگوێرەی تێگەیشتنی سەلەفی سالْح ،کورتی دەکەیتەوە و دەڵێی: من سەلەفیم.

دواتر وەکو ئەوە وایە کە بڵێی:من سوننیم،واتە:لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە دەڕۆم، هیچ جیاوازیەکی تێدا نییە .

ئینجا ئەو ناوانەی کە بەکارهێنانیان دروستە و،بەڵگەن لەسەر ئیسلامە ڕاستەقینەکە ئەمانەن :

١-أهل السنة والجماعة .

٢-الفرقة الناجية .

٣-الطائفة المنصورة .

٤-أهل الأثر .

٥-أهل الحديث .

٦-السلفيون .

٧-الغرباء .

٣-ئینجا دێینە سەر ڕوونکردنەوەی وشەی سەلەفییەت(السلفية): سەلەفییەت بریتییە لە ڕێبازەکە،واتە:قورئان و فەرمووده بە پێی تێگەیشتنی پێشینە چاکەکان (الكتاب والسنة بفهم سلف الأمة) .

سەلەفییەت: ڕێبازێکە یەکسانە بە ئەهلی سوننە و جەماعە، نەك شتێکی جیابێ، کە ئەویش بریتییە لە ئیسلامە ڕاستەقینەکە .

بۆیەش شوێنکەوتنی سەلەفییەت لەسەر هەموو کەسێك پێویستە، دواتریش باسی لێوە دەکەین .

وە هەروەها سەلەفییەت حیزبێك نییە کەسانێك دایانمەزراندبێ و، تایبەتی کەن بەخۆیان، بەڵکو ئیسلامە ڕاست و دروستەکەیە و، موڵکی هەموو کەسێکە کە دەستی پێوە بگرێ .

زانایانیش وشەی(سەلەفییەت)یان بەکارهێناوە وەکو :

شەیخ ولئیسلام ئیبن و تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: (واعلم أنه ليس في العقل الصريح ولا في شيء من النقل الصحيح مايُوجب مخالفة الطريقة السلفية أصْلا). واتە:باش بزانە نە عەقلی پاك و نەقڵی ڕاست و دروست هیچیان پێچەوانەی ڕێبازی سەلەفییەت نینە .

وە لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێ: (وأما السلفية فعلى ما حكاهُ الخطابي و أبوبكر الخطيب وغيرها، قالوا:مذهب السلف إجراء أحاديث الصفات وآيات الصفات على ظاهرها مع نفي الكيفية والتشبيه عنها، فلا نقول:إن معنى اليد القدرة،ولا:إن معنى السمع العلم،وذلك أن الكلام فى الصفات فرع على الكلام فى الذات يحتذى في حذوه،و يتبع فيه مثاله،فإذا كان إثبات الذات إثبات وجود لا إثبات كيفية،فكذلك إثبات الصفات إثبات وجود لا إثبات كيفية).

وەهەروەها ئیمامی ئیبن ولقەیمیش(ڕەحمەتی خوای لێبێ)لەسەرەتای پەرتووکی (روضة المحبين،ص٢٠)دا دەفەرمووێ: (وما يناسب ذلك من نكت تفسيرية، وأحاديث نبوية، ومسائل فقهية، وآثار سلفية، وشواهد شعرية،....).

سەلەفییەت ناوێك نییە لە جیاتی ئیسلام بەکاربێت، یاخود شتێکی جیا نییە لە ئیسلام، بەڵکو ڕوونکردنەوە و جیاکردنەوەی ئەو ئیسلامەیە کە سەلەفی صاڵح لەسەری بوونە .

کەواتە سەلەفییەت جگە لە ئیسلامە ڕاست و دروستەکە هیچ شتێکی تر نییە !!!

## واجبیێتی شوێنکەوتنی ڕێبازی سەلەفییەت

لەم بەشەدا باسی واجبیێتی شوێنکەوتنی ڕێبازی سەلەفییەت دەکەین بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەی صەحیح و یەکدەنگی زانایان، وەهەروەها وتەی چەند زانایەکیش .

یەکەم: واجبیێتی شوێنکەوتنی پێشینە چاکەکان لە قورئاندا :

١ -خوای پەروەردگاری دەفەرمووێ: (والسابقون الأولون مِن المهاجرين والأنصار والذين اتَّبعوهم بإحسان رضى الله عنهم وَرضوا عَنه وأعد لهم جنات تجر dتحتها الأنهار خالدين فيها أبَدا ذلِك الفوز العظيم) واتە: موسڵمانە پێشکەوتووە یەکەمەکان لەکۆچەران و پیشتیوانان و ئەوانەش زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییە ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون، وە خوا بەهەشتانێکی بۆ ئامادەکردوون کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، بەهەتاهەتایش تێیدا دەمێننەوە،هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورە و بەنرخ .

لەم ئایەتەدا دەبینین خوای گەورە ئەو پاداشتەی داناوە بۆ هاوەڵەکان و هەرکەسێکی تریش کە بەچاکە شوێنیان بکەوێ،کەواتە ئەمە هاندانە لەسەر شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵح و،ڕوونکردنەوەی پاداشتی ئەو کەسەشە کە شوێنیان دەکەوێ .

ئیمامی مالیکیش(ڕەحمەتی خوای لێبێ)ئەو ئایەتەی کردۆتە بەڵگە لەسەر واجبێتی شوێنکەوتنی هاوەڵان .

٢ -خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ: (ومن يُشاقق الرسول مِن بعد ما تبين له الهدى ويتَّبع غير سَبيل المؤمنين نولهِ ما تولى ونُصله جَهنم وساءَت مصيرا) .

واتە:هەرکەسێك دژایەتی و سەرپێچی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بکات، پاش ئەوەی ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە و،شوێنی ڕێگایەکی تر بکەوی بێجگە لە ڕێگای بڕواداران ئێمەش ڕووی ئەکەینە ئەو بەرنامە و ڕێگایەی بە ئارەزووی خۆی لە دونیادا هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێمە وازی لێ دێنین و، هەقمان نییە بەسەریەوە و،لە قیامەتیشدا ئەیخەینە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە .

لەم ئایەتەشدا دەبینین خوای گەورە ئەو هەڕەشە توند و تیژەی ئاڕاستەی ئەو کەسانە کردووە کە دژایەتی و سەرپێچی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکات دەکەن، وە هەروەها شوێن ڕێبازی غەیری ئیمانداران دەکەون.وەیەکەم ئیماندارانێکیش کە دەچنە ژێر واتای ئەو ئایەتە پێشینە چاکەکانن .

کەواتە لەو ئایەتەدا خوای گەورە تەنها باسی سەرپێچی پێغەمبەری نەکرد، بەڵکو باسی شوێنکەوتنی ڕێبازی غەیری ئیماندارانیش کرد، جا بۆ ئەوەی ئینسان ڕزگاری ببێ لەو هەڕەشە توندە دەبێ گوێڕایەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکات، وە شوێن ڕێبازی پێشینە چاکەکانیش کەوێ .

٣-خوای گەورە دەفەرمووێ: (يأيها الذين ءامنوا اتَّقوا الله وكونوا مَع الصادِقين) .

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە تۆڵەی خوا، وە هەمیشە لەگەڵ ڕاست گۆیاندا بن و لە ڕیزی ئەواندا بن .

عبد الله كوری عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ) دەفەرمووێ:لەگەڵ موحەممەد (صلی الله عليه وسلم) و هاوەڵەكانی دابن .

بێ گومان پێشینە چاكەكان پێشەوای ڕاستگۆیانن، وە هەر كەسێكیش لە دوای ئەوان بێت، ئەوە ڕاستگۆییەكەی لەوەدایە كە شوێن ئەوان بكەوێ .

ئەو لەگەڵ بوونەی فەرمانی پێكراوە،بریتییە لە لەگەڵ بوونی شوێنكەوتن و چاولێكردن لەبوارەكانی زانست و تێگەیشتن و كردەوە و بیروباوەڕ.

ئینجا هەركەسێك سەرپێچی سەلەفی ساڵح بكات لەو شتانە، یا لە شتی تر لەگەڵیان بێ،ئەوە لەو شتەی سەرپێچی ئەوانی كردووە لەگەڵیان نییە، ئەو كاتیش بەگشتی دەوترێ لەگەڵ ئەوا نییە،بەتایبەتی ئەگەر لەبواری بیروباوەڕ سەرپێچیان بكات و وەكو وان نەبێت (ئەمەش وتەی ئیبن و لقەییم بوو بەكەمێك دەستكاریەوە) .

دووەم: واجبییێتی شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵح لەفەرمووده صەحیحەکاندا :

١ -عرباضی کوڕی ساریە(ڕەزای خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (وعَضنا رسول الله(صلى الله عليه وسلم) موعضة بليغة وجلت منها القلوب، وذَرفت منها العيون، فقلنا يارسول الله، كأنها موعظة مودع فأوصنا،قال:أوصيكم بتقوى الله، والسمع والطاعة وإن تأمر عليكم عبد حبشي، وإنهُ من يعيش منكم فسيرى إختلافا كثيرا،فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين عَضوا عليها بالنواجذ، وإياكم ومحدثات الأمور، فإن كُل بدعة ضلالة) .

واتە: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری کردین،ئامۆژگاریەك بوو دڵەکان پێی دەهاتە لەرزین و،چاوەکان فرمێسکی پێدا دەهاتە خوارەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا پێ دەچێت ئەمە ئامۆژگاری ماڵ ئاوایی بێت، جا ئامۆژگاری خێرمان بکە،ئەویش فەرمووی:ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی کە تەقوای خوا بکەن و لێی بترسن،وە گوێگر و گوێڕایەڵ بن بۆ کاربەدەستە موسڵمانەکانتان ئەگەر بەندەیەکیش بێت، چونکە هەریەك لە ئێوە بژییێت و تەمەنی درێژ بێت ئەوە جیاوازییەکی زۆر دەبینێت،بۆیە ئێوە پەیوەست بن بە ڕێبازی من و ڕێبازی جێنشینە ڕێپیشاندەر و ڕێنمایکراوەکان،بە کاکیلەکانتان بیگرن، واتە: بەتوندی دەستی پێوە بگرن و بەریمەدەن،وە ئاگادارتان دەکەمەوە لەشتە داهێنراوەکان، چونکە هەموو داهێنراوێك لەدیندا گومڕاییە .

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمان دەکات بە شوێنکەوتنی ڕێبازی جێنشینەکانی لە بواری بیروباوەڕ و، کردەوە و، تێگەیشتن دا .

ئینجا یەکێك لە خاڵەگرنگەکانی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دوای ئەوەی باسی سوننەتی خۆیی و سونەتی خەلیفەکانی کرد، فەرمووی (عضوا عليها بالنواجذ) نەیفەرموو(عضوا عليهما) کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتی خۆی و سوننەتی خەلیفەکانی یەك ڕێگە و ڕێبازە، بۆیەش دەستگرتنی تەواو بە سوننەتی پێغەمبەر ئەوکاتە دەبێ کە دەستگرتن بە سوننەتی هاوەڵانی لەگەڵ بێت .

٢ -پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ: (خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم) واتە: باشترین خەڵك خەڵکانی سەردەمی منن (هاوەڵەکان)،پاشان ئەوانەی بەدوای وان دادێن(تابعيەکان)،پاشان ئەوانەی بەدوای وان دادێن(تابعی تابعييەکان) .

وە هەروەها لەفەرموودەیەکی تریشدا هاتووە کەماناکەی لەو فەرموودەیە نزیکە، عن أبي هريرة قال:سُئل رسول الله(صلى الله عليه وسلم)أي الناس خير؟ فقال: (أنا، والذين معي، ثم الدين على الأثر، ثم الذين على الأثر))ثم كأنه رفض من بقي). واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)چ کەسێك باشترین کەسە؟ فەرمووی: من و ئەوانەی لەگەڵ منن، پاشان ئەوانەی لەسەر

شوێنەواری ئەوان دەڕۆن(تابعیەکان)، پاشان ئەوانەی لەسەر شوێنەواری ئەوان دەڕۆن(تابعی تابعیەکان). پاشان وەکو بڵێی ئەوەی تری کە ماوە هەمووی ڕەتکردەوە .

کەواتە خێر لەسەلەفی ساڵح و ئەو کەسەش دایە کە شوێن ئەوان بکەوێ، جگە لەمانە خەیریان تێدا نییە .

شەیخ ولئیسلام ئیبن و تەیمییە دەفەرمووێ: (ومن المعلوم بالضرورة لمن تدبر الكتاب والسنة وما اتفق عليه أهل السنة والجماعة من جميع الطوائف؛ أن خير قرون هذه الأمة - في الأعمال والأقوال والاعتقاد وغيرها من كل فضيلة - أن خيرها؛ القرن الأول، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم - كما ثبت ذلك عن النبي صلى الله عليه وسلم من غير وجه -وأنهم أفضل من الخَلف في كل فضيلة، من علم وعمل وإيمان وعقل ودين وبيان وعبادة، وأنهم أولى بالبيان لكل مشكل، هذا لا يدفعه إلا من كابر المعلوم بالضرورة من دين الإسلام وأضله الله على علم، كما قال عبد الله بن مسعود رضي الله عنه: "من كان منكم مستنا فليستن بمن قد مات، فإن الحي لا تؤمن عليه الفتنة، أولئك أصحاب محمد؛ أبر هذه الأمة قلوبا، وأعمقها علما، وأقلها تكلفا، قوم اختارهم الله لصحبة نبيه وإقامة دينه، فاعرفوا لهم حقهم، وتمسكوا بهديهم، فإنهم كانوا على الهدى المستقيم"، وقال غيره: "عليكم بآثار من سلف، فإنهم جاءوا بما يكفي وما يشفي، ولم يحدث بعدهم خير كامن لم يعلموه"... وما أحسن ما قال الشافعي رحمه الله في رسالته: "هم

فوقنا في كل علم وعقل ودين وفضل وكل سبب ينال به علم أو يدرك به هدى، ورأيهم لنا خير من رأينا لأنفسنا") .

٣ -پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: ((تفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة،كلهم فى النار إلا واحدة))قالوا: وما هي تلك الفرقة؟قال:((ما أنا عليه اليوم وأصحابي)) .

واتە: ئەو ئوممەتە دەبێتە حەفتاو سێ فیرقە، هەموویان بۆ ناو ئاگرن، تەنها یەکێکیان نەبێت بۆ بەهەشتە.وتیان:ئەو فیرقەیە کامەیە(کە ڕزگاری دەبێ)؟ فەرمووی: ئەوانەن کە لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆن کە ئەمڕۆ من و هاوەڵەکانم لەسەری دەڕۆین .

لەو فەرموودەیەشدا زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی دیارە کە ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەیە کە لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆن،کە کاتی خۆی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی لەسەری بووینە،جگە لەو ڕێگەیە هەر هەمووی بەرەو تیاچوون و گومڕایی و پاشانیش ئاگری دۆزەخە .

سێیەم: یەکدەنگی زانایان لەسەر واجبێتی شوێنکەوتنی ڕێبازی سەلەف : زانایانی ئەهلی سوننە یەکدەنگن کە شوێنکەوتنی سەلەف پێویستە،وەهەروەها تێگەیشتنی ڕاست و دروستیش بۆ کیتاب و سوننە بریتییە لە تێگەیشتنی پێشەوایانی سەلەف .

١- ئیمامی ئیبن وقودامەی مەقدیسی(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (فقد ثبت وجُوب إتباع السلف-رحمة الله عليهم-بالكتاب،والسنة،والإجماع). واتە: واجبێتی شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵح جێگیر بووە، بەبەڵگەی قورئان و، فەرمووده و،کۆڕای زانایان .

٢ -شەیخ ولئیسلام ئیبن تەیمییە دەفەرمووێ: (ولا عيب على من أظهر مذهب السلف، وانتسب إليه، واعتزى إليه، بل يجب قبول ذلك منه بالإتفاق،فإن مذهب السلف لايكون إلا حقا). واتە:هیچ عەیب نییە بۆ ئەو کەسەی کە ڕێبازی سەلەف ئاشکرا دەکات و،خۆی دەداتە پاڵی،وە شازی پێوە دەکات،بەڵکو پێویستە ئەوەی لێ وەربگیرێ بە یەکدەنگی زانایان، چونکە ڕێبازی سەلەف تەنها حەقە .

چوارەم: وتەی زانایانی ئەهلی سوننە دەربارەی واجبێتی و،فەزڵی شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵح .

١ -عبدالله کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (ألا لا يُقلدن أحدكم دينه رجلا، إن آمن آمن، وإن كفر كفر، فإن كنتم لابد مقتَدين، فبالميت، فإن الحي لايؤمن عليه الفتنة) .

٢ -عبدالله کوڕی مەسعود دەفەرمووێ: (لاتقلدوا دينكم الرجال، فإن أبيتم فبالأموات، لا بالأحياء) .

٣ -عبدالله کوڕی مەسعود دەفەرمووێ: (ألا لا يقلدن رجل رجلا دينه، فإن آمن آمن، وإن كفر كفر، فإن كان مقلدا لا محالة، فليقلد الميت، ويترك الحي، فإن الحي لا تؤمن عليه الفتنة) .

٤ -عبدالله کوڕی مەسعود دەفەرمووێ: (من كان منكم مُتأسيا، فليتأس بأصحاب محمد(صلى الله عليه وسلم)،فإنهم كانوا أبرا هذه الأمة قلوبا، وأعْمقها علما، وأقلَّها تكلفا، وأقومها هدْيا، وأحسنها حالا، قوم إختارهم الله تعالى لصحبة نبيه (صلى الله علية وسلم)، فاعرفوا لهم فضلهم، واتبعوهم في آثارهم، فإنهم كانوا على الهدى المستقيم) .

٥ -وە عبداللەی کوڕی عومەریش(ڕەزای خوایان لێبێ) دەفەرمووێ: (من كان منكم مستنا، فليستن بمن قد مات، أولئك أصحاب محمد(صلى الله عليه وسلم) كانوا خير هذه الأمة، أبرها قُلوبا، وأعمقها علما، وأقلُّها تكلفا، قوم إختارهم الله تعالى لصحبة نبيه(صلى الله عليه وسلم) واتای ئەسەری(١و٢و٣):ئاگادار بن هیچ یەکێك لە ئێوە با لە دینەکەیدا تەقلیدی کەسێکی تر نەکات، بەشێوەیەك:ئەگەر ئیمانی هێنا ئەویش ئیمان بێنێ، وە ئەگەر کافر بوو ئەویش کافر ببێ، بەڵام ئەگەر هەر تەقلیدی کەسێکتان کرد، ئەوە تەقلیدی مردووەکان بکەن، نەك زیندوو، چونکە ئینسانی زیندوو لە فیتنەی ئەمین نی .
واتای ئەسەری چوارەمی ئیبن مەسعود و ئەسەرەکەی ئیبن عومەریش ئەوەیە: هەرکەسێك لە ئێوە ئەگەر دەیەوێ ئیقتیدا بەکەسێکەوە بکات و، شوێن ڕێبازێك کەوێ، ئەوە با ئیقتیدا بە مردووەکان(هاوەڵەکان)بکات و،شوێن ڕێبازی ئەوان بکەوێت، چونکە ئەوان لەهەموو خەڵکی باشتر بووینە و، دڵیان لە دڵی هەموو کەس باشتر بووە، عیلمیان لەهەموو کەس زیاتر بووە، کەسانێك بووینە خوای گەورە هەڵیبژاردوون بۆ هاوەڵایەتی پێغەمبەرەکەی، بۆیە ئێوەش فەزڵیان بزانن و،شوێنیان کەون، چونکە ئەوان لەسەر ڕێگایەکی ڕاست بووینە .

٦ -عبد الله ی کوڕی عومەڕ دەفەرمووێ: (لا يزال الناس على الطريق، ما اتبعوا الأثر). واتە:خەڵکی بەردەوام لەسەر خەیرن، هەتا ئەو کاتەی شوێن ئەسەر بکەون .

٧ -ئیمامی شافعی(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ:هاوەڵان لەسەروو ئێمەوەن لە هەموو تێگەیشتن و زانست و چاکە و هۆکارێك کە زانستی پێی بەدەست بێت، یاخود بەهۆیەوە بگەی بەڕاستی، وە بۆچوونی ئەوان باشترە بۆ ئێمە لە بۆچوونی خۆمان بۆ خۆمان .

٨ -ئیمامی ئەحمەد(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (أصول السنة عندنا: التمسك بما عليه أصحاب الرسول الله(صلى الله عليه وسلم)،والإقتداء بهم، وترك البدع....). واتە:بنچینەکانی سوننەت لەلای ئێمە بریتیین لە: دەستگرتن بەو ڕێبازەی کە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوای لەسەر بووە و،شوێنکەوتنیان، وە وازهێنان لەشتە داهێنراوەکان .

٩-ئیمامی ئەوزاعی(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (عليك بآثار من سلف، وإن رفضك الناس، وإياك وآراء الرجال،وإن زخرفوه لك بالقول فإن الأمر ينجلي وأنت على طريق مستقيم). واتە:پێویستە لەسەرت شوێن ئەسەری سەلەف بکەوی، ئەگەر چی خەڵکیش تۆیان نەوێ،وە وریابە لەبیروبۆچوونی پیاوان، ئەگەر چی بەقسەی باق و بریق بۆتی بڕازێننەوە و جوانی بکەن، چونکە ئەو کاتەی شتەکان ڕوون دەبێتەوە، ئەوە تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاست بووی .

١٠-وەهەروەها دەفەرمووێ: (إصبر نفسك على السنة، وقف حيث وقف القوم، وقل بما قالوا، وكف عما كفوا عنه، واسلك سبيل سلفك الصالح فإنه يسعك ما وسعهم). رواه الآلكائي.واتە: نەفسی خۆت ئارام پێبگرە لەسەر سوننەت، لەو شوێنە ڕاوەستە کە سەلەف لێی ڕاوەستاون،ئەوان چیان وتووە،تۆش ئاوا بڵێ،وازبێنە لەوشتەی کە ئەوان وازیان لێهێناوە و، ڕێگەی پێشینە چاکەکانت بگرە، چونکە بەڕاستی ئەوەی بۆ وان بەس بووە بۆ تۆش بەسە .

١١- ئیمامی عبدالحمیدی کوڕی بادیس(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: (الإسلام إنما هو في كتاب الله وسنة رسول(صلى الله عليه وسلم)،وما كان عليه سلفنا من أهل القرون المشهود لهم بالخيرية على لسان الصادق المصدوق) . واتە: ئیسلام بریتییە لە پەڕاوەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەر و،ئەوەش کە پێشینە چاکەکان لەسەری بووینە، ئەوانەی کەلەسەر زمانی پێغەمبەر شایەتی چاکەیان بۆ دراوە .

١٢-شێخ بەکر ئەبو زەیدیش(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (كن سلفيا على الجادة، طريق السلف الصالح من الصحابة رضى الله عنهم،فمن بعدهم ممن قفا أثرهم في جميع أبواب الدين،من التوحيد،والعبادات،ونحوها....). واتە: تۆ کەسێکی(سەلەفی)بە لەسەر ڕێگە ڕاستەکە بڕۆ، ڕێگەی سەلەفی ساڵح .(.....

## بنەما و بنچینەکانی ڕێبازی سەلەفییەت

لەم بەشەدا ئەو بنەما و بنچینانە باس دەکەین کەوا ڕێبازی سەلەفییەت و بانگەوازەکەی لەسەر دامەزراوە .

دیارە هەر ڕێبازێك لەسەر چەند بنچینەیەك دامەزراوە، کەسانی پەیوەست بەو ڕێبازە خۆیانی لەسەر پەروەردە دەکەن و بانگەوازیش هەر بۆ ئەو بنچینانە دەکەن .

جا بانگەوازی سەلەفییەتیش لەسەر سێ بنچینەی سەرەکی دامەزراوە و گرنگی زۆریشی پێدەدات، کە پێویستە کەسی سەلەفی خۆی لەسەر ئەو سێ بنچینە گرنگە پەروەردەبکات و،بانگەوازیشی بۆ بکات، ئەو سێ بنچینەیەش بریتین لە :

یەکخواپەرستی(التوحید) .

١ -شوێن کەوتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) (الإتباع)

٢ -پاککرنەوەی دڵ و دەروون (التزكية)

ئێستاش دێین بەکورتی لەسەر هەریەك لەو سێ بنچینەیە دەدوێین -:

یەکەم: یەکخواپەرستی:گرنگترین بنچینەی بانگەوازی سەلەفییەت بریتییە لە یەکخواپەرستی،چونکە خوای گەورە لە پێناوی یەکخواپەرستی مرۆڤ و جنۆکەکانی دروست کردووە، هەر لە پێناوی ئەم بنچینەیە خوا پێغەمبەرانی

ناردووه و، پەڕاوەکانی دابەزاندووە، وەهەروەها جیهادیشی هەر لەو پێناوەدا داناوە، وەبەهۆی ئەم بنچینەیەیە کە خەڵکی بووینە دوو کۆمەڵ، ئیماندار و کافر، یەکخواپەرست و موشریك، بۆیەش ئیمامی ئیبن ولقەییم دەفەرمووێ: قورئان هەر هەموو باسی یەکخواپەرستییە .

خوای پەروەردگار هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، یەکەمجار فەرمانی پێکردووە کە بانگەواز بۆ یەکخواپەرستی بکات. وەکو دەفەرمووێ: (ومَا أرسلْنا من قبلك مِن رسول إلا نوحي إليه أنه لا إله إلا أنا فاعْبدون). واتە:ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە، مەگەر نیگامان بۆ ناردووە(بەوەی کە)بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە، کەواتە تەنها من بپەرستن .

وەهەروەها دەفەرمووێ: (ولقد بَعثنا في كُل أمة رسولا أن اعْبدوا الله واجتَنبوا الطاغوت) .

ئینجا (اعْبدوا الله مالكم من إله غَيره)، ئەمە وتەی زۆرێك لە پێغەمبەران بووە کە بەگەلەکەی خۆیان گوتووە، وەکو خوای پەروەردگار لە هود و،ساڵح و، ئیبراهیم و،موسا و،عیسا(عليهم الصلاة والسلام)دەگێڕێتەوە،بەڵکو ئەمە قسەو پەیامی هەموو پێغەمبەران بووە بەرامبەر گەلەکەیان، چونکە پەیامی پێغەمبەران یەك بووە .

بۆیە پێویستە کەسی سەلەفی گرنگیەکی زۆر زۆر بەم بابەتە بدات و تەمەنی خۆی لە پێناویدا سەرف بکات، چ لە ڕووی شارەزابوون و کارپێکردنی بێت، یا لە ڕووی بانگەواز بۆ کردن بێت، پێویستە خەڵکی لە شیرك و جۆرەکانی ئاگادار بکاتەوە و، فێری یەکخواپەرستییان بکات .

جا هەر بانگخوازێك گرنگی بەم بابەتە نەدات و لەسەرەتای کاری بانگەوازەکەی دانەنێت، بەڵکو بچێ خۆی بەشتی فەرعی و جوزئییاتەوە خەریك بکات و، ئەم بنچینە گەورەیە پشت گوێ بخات، ئەوە بێگومان بانگەوازەکەی وەکو بانگەوازی پێغەمبەران نییە، بەڵکو هەڵەیە .

بەکورتی ئەگەر بمانەوێ بانگەوازی سەلەفییەت پێناسە بکەین، ئەوە دەڵێین: بانگەوازی یەکخواپەرستیە !!!

یەکخواپەرستیش سێ جۆری هەیە :

١ -یەکخواپەرستی لە پەروەردگارێتیدا(توحيد الربوبية) .

٢ -یەکخواپەرستی لە پەرستندا(توحيد الألوهية) .

٣ -یەکخواپەرستی لەناو و سیفەتەکانی خوای گەورەدا(توحيد الأسماء والصفات) .

*تێبینیەکی گرنگ: مەدخەلییەکان زۆر جار دەڵێن: ئێمە بانگەواز بۆ یەکخواپەرستی دەکەین و، خەڵکیش ئاگادار دەکەینەوە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا، بەڵام دەبینین کە باسی تەوحید دەکەن، بەزۆری باس لە هاوارکردنە خوا و قوربانی سەربڕین بۆ خواو نەزرکردن بۆ خوا و...هتد دەکەن، کەم وایە باسی تەوحیدی حاکمییەت بکەن و گرنگی پێبدەن، یا کە باسی شیرك دەکەن، تەنها باسی شیرکی گۆڕەکان دەکەن، باسی شیرکی قەسرەکان و حاکمەکان ناکەن، کە مافی یاسادانانیان بۆ خۆیان داناوە و،حوکم بەبەرنامەکەی خوا ناکەن،ئێ باشە شیرك هەر شیرکە، چ شیرکی گۆڕپەرستەکان بێت، یا شیرکی حاکمە تاغووتەکان بێت، ئەگەر ڕاست دەکەن خەڵکی ئاگادار دەکەنەوە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا، ئەوە دەبێ خەڵکی لە هەردوو جۆرەکە ئاگادار بکەنەوە، نەك شەو و ڕۆژ باسی شیرکی گۆڕپەرستەکان بکەن، بەڵام بێدەنگ بن لە شیرکی حاکمە تاغووتەکان و،بەڵکو بەرگرییان لێ بکەن، یا بە ئەمیر و دەستەڵاتداری خۆتانیان بزانن !!!

خوای پەروەردگار چۆن فەرموویەتی: (وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه).

بەهەمان شێوەش لە چەند شوێنێکدا فەرموویەتی: (إن الحكم إلا لله).

هەروەکو چۆن فەرموویەتی: (ولا يشرك بعبادة رَبه أحدا). بەهەمان شێوەش فەرموویەتی: (ولا يشرك فى حُكمه أحدا) .

ئیمامی شەنقیطیش (ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (الإشراك بالله فی حكمه، والإشراك به فی عبادَته كلها بمعنى واحد، لا فرق بينهما ألبتة، فالذي يَتبع نظامها غير نظام الله، وتشْريعا غير تشريع الله، كالذي يعبد الصَنم ويسجد للوثن، ولا فرق بينهما ألبتة، بوجه من الوجوه، فهما واحد، وكلاهما مشرك بالله) . واتە: هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا لە حوكم و،پەرستنیدا هەردووكی بە یەك واتا دێت،بە هیچ شێوەیەك جیاوازی لە نێوانیاندا نییە،جا ئەو كەسەی شوێن یاساو دەستورێك دەكەوێت جگە لە یاسا و دەستوری خوا،ئەوە وەكو ئەو كەسە وایە كە بتێك دەپەرستێ و سوجدە بۆ بتێك دەبات، بە هیچ شێوەیەك جیاوازی لە نێوانیاندا نییە،لە هیچ ڕوویێك لە ڕووەكان،كەواتە هەردووكیان یەكن و، هەردووكیان هاوبەش بڕیاردەرن بۆ خوا .

دووەم: شوێنكەوتنی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم):دوای ئەوەی كەسی سەلەفی شارەزای یەكخواپەرستی و جۆرەكانی بوو، ئەوە پێویستە لەسەری بەتەنها شوێن پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم)بكەوێ و، قسەی كەس بە پێش قسەی پێغەمبەر نەخات، وەهەروەها عیبادەتەكانی بەو شێوەیە بێت كە پێغەمبەر ئەنجامی داوە، نەك بە گوێرەی هەوا و ئارەزوو و، بیدعە. ئەمەش داخوازی وشەی(أشهد أن محمد رسول الله)یە .

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:(وما ءاتاكم الرسول فخذوه وما نَهاكم عنه فانتهوا) .

وە دەفەرمووێ: (قل إن كنتم تُحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم والله غفور رحيم) .

وە دەفەرمووێ (من يطُع الرسول فقد أطاع الله) .

وە دەفەرمووێ: (لقد كان لَكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجوا الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا). واتە:سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشق و پێشەوایەتی چاك بۆ ئێوە هەیە ، بۆ کەسێ بە هیوای خوا و پاداشتی ڕۆژی دواییە، وە زۆر یادی خوا دەکات .

فەرموودەش زۆرە لەو بوارەدا، لەوانە فەرموودەکەی(عرباض)کە تیایدا هاتووە: (فإنه من يعيش منكم بعدي فسيرى إختلافا كثير، فعليكم بسنتي).یا خود: (من عمل عملا ليس عليه أمرنا، فهو رد) .

عبداللەی کوڕی مسعود(ڕەزای خوای لێبێ) دەفەرمووێ: (إتبعوا ولا تبتدعوا فقد كفيتم). واتە: ئێوە شوێن کەوتە بن و، شت دامەهێنن لە دیندا، چونکە ئەوە بەستانە .

ئیمامی زوهری(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ:دەست گرتن بە سوننەت هۆی ڕزگاربوونە، چونکە سوننەت وەکو ئیمامی مالیك فەرمووی:وەکو کەشتیەکەی نوح وایە، هەرکەسێ سواری ببێ ڕزگاری دەبێ، وە هەرکەسێکیش لێی بە پاشکەوێ و سواری نەبێ ئەوە تیا دەچێ .

خوای پەروەردگار هیچ کردەوەیەك قەبووڵ ناکات، مەگەر دوومەرجی تێدا بێتە دی :

١ -بەتەنها بۆ خوا بێ(الإخلاص) .

٢-بە گوێرەی سوننەت بێت(الصواب) .

بۆیە پێویستە موسڵمان عیبادەتەکانی بە گوێرەی سوننەت بێت، وە هەروەها بانگەوازی خەڵکیش بکات کە لەسەر سوننەت بڕۆن و دوورکەونەوە لە بیدعە، جا چ بیدعەی بیروباوەڕی بێت،یا بیدعەی کردەوەیی بێت .

وە هەر بانگەوازێك لەسەر ئەم بنچینە گرنگە (الإتباع)دانەمەزرابێ و، گرنگی پێنەدات، ئەوە بانگەوازێکی فاشیلە و بێ بەرهەمە .

تێبینی: مەدخەلییەکان شەو و ڕۆژ باسی بیدعە دەکەن و دەڵێن:ئێمە خەڵکی ئاگادار دەکەینەوە لەشتە داهێنراوەکان، ئێمەش پێیان دەڵێین:ئێوە جارێ بیروباوەڕی خۆتان لە بیدعە گەورە و گومڕاییەکان پاککەنەوە، کە تووشی چەندان بیدعەی بیروباوەڕی وابووینە لە مێژوودا کۆمەڵی وا گومڕا کەم بووە، لەیەك کاتدا دوو بیدعەی زۆر گەورەتان لە خۆتاندا کۆکردۆتەوە کە بیدعەی

ئیرجاء و خەواریجە، ئێوە(لە ڕاستیدا هەویرێکن لە ئیرجاء و خەواریج شێلدراون)،ئێوە خۆتان نەخۆشن جارێ چارەسەری دەردی خۆتان بکەن ئەوجار وەرنەوە چارەسەری دەردی موسڵمانان بکەن !!!

کەواتە پێویستە کەسی سەلەفی گرنگیەکی باش بدات بە لایەنی سوننەت و بیدعە، خۆی شارەزا بکات لەو لایەنەو خەڵکیشی لەسەر پەروەردەبکات بەگوێرەی توانا .

سێیەم: پاککردنەوەی دڵ و دەروون: تەزکیەی نەفس واتە:گەشەپێدان و، پاککردنەوەی نەفس لەشتە پیس و خراپەکان .

تەزکیە یەکێکە لەو کارەگرنگانەی کە خوای گەورە لە پێناویدا پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم)ڕەوانە کردووە، وەکو دەفەرمووێ: (هو الذي بعث في الأميين رسولاً منهم يتلو عليهم آياته ويُزكيهم ويُعلمهم الكتاب والحكمة وإن كانوا من قبل لفي ضَلال مبين). واتە:خوا ئەو زاتەیە کە لەناو عەرەبە نەخوێندەوارەکاندا پەیامبەرێکی پایە بەرزی لە خۆیان بۆ نارد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و، دڵ و دەروون و ڕواڵەتیان پاك دەکاتەوە، وەقورئان وفەرموودەکانی خۆیان فێر دەکات، هەر چەند ئەوان لە پێشدا لە گومڕاییەکی ئاشکرادابوون .

وەهەروەها خوای گەورە لە قورئاندا یازدە سوێندی لەدوای یەك خواردووە-کە لە هەموو قورئاندا لەسەرەتاوە تا کۆتایی سوێند خواردنێکی ئاوا نییە جگە لەم شوێنە نەبێ-لەسەر ئەوەی ڕزگاربوون بەستراوەتەوە بە تەزکیەی نەفس، وەکو دەفەرمووێ: ( والشمس وضُحها* والقمر إذا تلاها*والنهار إذا جلاَّها*والليل إذا يغْشاها* والسماء وما بَناها* والأرض وما طَحاها*ونفس وما سواها* فألهمها فجورها وتقواها*قد أفلح من زكَّاها* وقد خاب من دسَّاها).

وەکو دەبینین خوای گەورە دەفەرمووێ: سوێند بەهەموو ئەوانە بەڕاستی ڕزگاری بوو، سەرفراز بوو ئەوەی کە دەروون و نەفسی خۆی پاك کردەوە لەگوناه و تاوان، وە بەڕاستی ئەوەشی کە دەروون و نەفسی خۆی بەگوناه و تاوان ئاڵودەکرد نا ئومێد بوو .

لە ئایەتێکی تریشدا ڕوونی دەکاتەوە ئەو کەسانە دەچنە بەهەشت کەوا نەفسی خۆیان پاك ڕاگرتووە، هەروەکو دەفەرمووێ: (وسيق الذين اتقوا ربهم إلى الجنة زُمرا حتى إذا جاءوها وفُتحت أبوابها وقال لهم خَزنتها سلامٌ عليكم طِبتم فادخلوها خالدين) .

واتە:وە کەسانێ کە لەپەروەردگارییان دەترسان دەبرێن بۆ بەهەشت پۆل پۆل،تا کاتێ دێنە نزیکی بەهەشت و دەرگاکانی دەکرێنەوە، وە دەرگاوانەکانی پێیان دەڵێن:سەلامتان لێ بێت، ئێوە پاك و خاوێن بوون(لەتاوان لە دونیادا)، کەواتە بڕۆنە ناو بەهەشت بە هەمیشەیی .

لە ڕووانگەی ئەم ئایەتانەوە دەگەینە دوو ڕاستی گرنگ :

یەکەم: تەزکیە یەکێکە لەکارە گرنگەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وە مەبەستێك بوو لەمەبەستەکانی پەیامەکەی، بەڵکو هەموو مەبەستی پەیامەکەی بریتی بووە لە تەزکیە .

دووەم: تەزکیە هۆکارێکە بۆ چوونە ناو بەهەشت .

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بۆ خۆی داوای تەزکیەی دەکرد و دەیفەرموو: (اللهم آت نفسي تقواها، وزكَّها وأنت خير من زكها،أنت وليُها ومولاها ) .

وە لەفەرموودەیەکدا ڕوونی دەکاتەوە کەپەیامی ئیسلام هەر هەمووی پەیامی تەزکیەیە و، پەیامەکەی کورت دەکاتەوە لەو مەبەستە، هەروەکو دەفەرمووێ: (إنما بعثت لأتمم مَكارم الأخلاق).صحيح،رواه أحمد والحاكم. واتە: من تەنها بۆ ئەوە نێردراوم کە خورەوشتە چاکەکان تەواو بکەم.وەتەزکیەی نەفسیش بە خورەوشتی جوانەوە دەبێت .

ئینجا سەرەتای دەست پێکردنی تەزکیەش لەلای ئەهلی سوننە لە عەقیدەوە دەست پێدەکات، واتە: لەسەرەتا دەبێ هەوڵدەین خۆمان لە پیسی شیرك و کوفر و نیفاق و بیدعە پاککەینەوە، دوای ئەوە خۆمان بڕازێنینەوە بەجوانی تەوحید و ئیمان و سوننە، چونکە گەورەترین پیسی بریتییە لەشیرك، ناکرێ ئینسان خۆی خەریك بکات بەعیبادەت و زوهد و ئەخلاقی جوان، بەڵام بیروباوەڕەکەی خەلەلی هەبێت و ناتەواو بێت !!!

ئەو سێ بنچینەیەی کە باسمانکرد، هەریەك لە شێخ(عبد الرحمن عبدالخالق و أحمد فريد)وەکو بنچینەکانی بانگەوازی سەلەفییەت باسیانکردووە، بەڵام دکتۆر(صلاح الخالدي)لە پەرتووکی(الخطة البراقة،ص٧٧-٧٨)دا باسی چەند بنەمایەك دەکات لە بنەماکانی ڕێبازی سەلەفی، منیش پێم باش بوو لە کۆتایی ئەم بەشەدا بۆتانی نەقڵ بکەم .

دەفەرمووێ: ئاماژە دەکەم بۆ چەند بنچینەیەکی سەرەکی لە(بنچینەکانی ڕێبازی سەلەفی)،کەوا لە ژیانی پێشینە چاکەکان ڕەنگی داوەتەوە :

١-ڕووکردنە قورئان:چ لەڕووی تەفسیرکردنییەوە بێت،یا تێگەیشتن و دەرهێنانی حوکم بێت، وە تێگەیشتن لە مەبەستە سەرەکییەکانی قورئان و،وەرگرتنی حوکمەکانی قورئان بۆ جێبەجێکردن، وەهەروەها کارکردن بۆ هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی وا کە قورئان داوای دەکات .

٢-تێگەیشتن و وەرگرتنی ژیاننامەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، لە هەموو لایەن و مەیدانەکانی، وەهەروەها پەیوەست بوون بە ڕێبازەکەی و، چاولێکردنی .

٣ -تێگەیشتن لە سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە خۆی دەبینێتەوە لە فەرموودە ڕاست و دروستەکان، ئینجا ئەو سونەتە بدرێتە پاڵ قورئان و، لە ڕوانگەی قورئانەوە لەسوننەت تێبگەین، پشت بەهەردووکیان ببەستین بۆ تێگەیشتنی ئیسلام و دەرهێنانی حوکم و یاساکانی .

٤-سەیرکردنی ژیانی هاوەڵە بەڕێزەکان(ڕەزای خوایان لێبێ)، وە یەپوەست بوون بە ڕێبازەکەیان، کە بەڕاستی ئەوان لەگەڵ قورئان و سوننەت ژیان و،لە ژیانیشیاندا بەختەوەر بوون.

٥-ڕەتکردنەوەو ڕازی نەبوون بەهەر ڕێبازێك یا تێگەیشتنێکی نامۆ کە پێچەوانە بێت لەگەڵ قورئان وسوننەت و تێگەیشتنی پێشینەکانی ئەو ئومەتە، جا خاوەنەکەی هەرکەسێك بێت .

٦-پشت بەستن بە قورئان و سوننەت وەکو تەرازوو و حەکەم، وە گەڕاندنەوەی هەر فیکرەو قسەیەك بۆلای ئەو تەرازووە، ئینجا وەرگرتنی ئەو شتەی کە موافیقی ئەو تەرازووە بێت، وە ڕەتکردنەوەی هەر بیروبۆچوونێك کە پێچەوانەی حەق بێت .

٧-کۆکردنەوەی ئومەت لەسەر قورئان وسوننەت و تێگەیشتنی سەلەفی ئومەت، وە ڕاوەستان دژی هەر بیرو بۆچوونێکی نامۆ کە هێرش دەکاتە سەر ئومەت، پەروەردەکردنی ئوممەت لەسەر حەق، وەهەروەها ئامادەکردنی بۆ جیهادکردن لە پێناوی خوای گەورە و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنانی خوا.

ئینجا دەفەرمووێ خاوەن عیلم ئەو کەسەیە کە پەیوەست دەبێ بەو بنچینە سەرەکیانە و جگە لەمانەش، بەگوێرەی ڕێبازی پێشینە چاکەکان .

## ئەو شتانەی کە بە هۆیەوە موسڵمان لە بازنەی سەلەفییەت دەردەچێت

لەم بەشەدا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی ئەو شتانە دەکەین کە بە هۆیەوە موسڵمان لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعە )سەلەفییەت(دەردەچێ و، دەبێت بە کەسێکی ئەهلی ئەهواء و بیدعەچی(مبتدع)

دیارە ئەم بابەتەش وەکو بابەتەکانی تر گرنگییەکی زۆری هەیە و، زانایانیش لە پەرتووکەکانیاندا باسیان کردووە .

چونکە بەڕاستی زۆر جار دەبینین و دەبیستین کەسانێك خۆیان بە سەلەفی و ئەهلی سوننە دەزانن، کەچی لەواقیعدا وانییە و، بیروباوەڕیان پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، بۆیە پێویستە ئاگاداری ئەو خاڵانە بین کە بە هۆیەوە موسڵمان لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعەوە دەردەچێ .

وە لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی کەسی بیدعەچی کەسێکی خراپ و زەمکراوە، بۆیە نابێ هەرکەسە و بەهەواو ئارەزووی خۆی خەڵك بە بیدعەچی دابنێ و لە بازنەی سەلەفییەت دەریانکات، بەڵکو ئەم بابەتە دەبێ بەشێوەیەکی زانستی و بە بەڵگەوە قسەی لەسەر بکرێت، بۆ ئەوەی ئینسان تێیدا تووشی هەڵەو تاوان نەبێت .

ئیمامی ئەحمەد(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (إخراج الرجل من السنة شديد). واتە:دەرکردنی پیاوێك لە بازنەی سوننەت شتێکی قورس و گرانە .

سەلەفییەت خاوەنی چەند بنەماو بنچینەیەکە، کە پێشەوایانی ئەهلی سوننە لەسەری یەکدەنگن، وە هەرکەسێکیش پێچەوانەی ئەو بنچینانە بێت ئەوە بەبیدعەچی ناویان بردووە و،لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعە دەریان کردووە .

یەکەم: خاڵی یەکەم کە بە هۆیەوە موسڵمان لەبازنەی ئەهلی سوننە دەردەچێ بریتییە لە: هەرکەسێك پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت لە سەرچاوەی وەرگرتنی دین، کە بریتییە لە(قورئان و فەرموودە و ئیجماع)، ئەهلی سوننە وجەماعە دینەکەی خۆیان لەو سێ سەرچاوەیە وەردەگرن، نەك لە شتی تر. بۆیە هەرکەسێك پێچەوانەی ئەهلی سوننە بێت لەو خاڵە، ئەوە کەسێکی بیدعەچییە.
شەیخ ولئیسلام ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: (فمن قال بالكتاب والسنة والإجماع فهو من أهل السنة والجماعة) .
وەهەروەها دەفەرمووێ: (ومن خالف الكتاب المستبين، والسنة المستفيضة، أو ما أجمع عليه سلف الأمة خلافا لايعذر فيه فهذا يعامل بما يعامل به أهل البدع).
واتە: هەرکەسێك پێچەوانەی قورئانی ڕوون و ئاشکرا و،سونەتی ناسراو بوو، یا پێچەوانەی ئەو شتە بوو کە پێشینەی ئومەت لەسەری یەکدەنگن،ئینجا پێچەوانە کردنێکی واش بوو کە بیانووی نەبوو تێیدا، ئەوە وەکو کەسێکی ئەهلی بیدعە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ .

دووەم: هەرکەسێك پێچەوانەی بنچینەیەك لە بنچینەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت لە بیروباوەڕدا، ئەوە کەسێکی بیدعەچییە .

ئیمامی ئیبن وتەیمییە دەفەرمووێ: (والبدعة التى يعد بها الرجل من أهل الأهواء: ما اشتهر عند أهل العلم بالسنة مخالفتها للكتاب والسنة، كبدعة الخوارج، والروافض، والقدرية، والمرجئة) .

واتە: ئەو بیدعەیەی کە پیاو بە هۆیەوە لە ڕێزی ئەهلی ئەهواء حیساب دەکرێ:بریتییە لەو بیدعەیەی کە ناسراوە لەلای ئەهلی عیلم پێچەوانەی کیتاب و سوننەیە، وەکو بیدعەی:خەواریج و،شیعە و،قەدەرییە و، موڕجیئەکان.

ئیمای شاطبیش(ڕەحمەتی خوای لێبێ)دەفەرمووێ: (أن هذة الفرق إنما تصير فرقا بخلافها للفرقة الناجية في معنى كلي في الدين، وقاعدة من قواعد الشريعة، لا في جزئي من جزئيات، إذا الجزئي والفرع الشاذ لا ينشأ عنه مخالفة يقع بسببها التفرق شيعا،وإنما ينشأ التفرق عند وقوع المخالفة في الأمور الكلية، لأن الكليات تضم من الجزئيات غير القليل....) .

شیخ علی خضیریش(خوا ئازادی بکات)دەفەرمووێ: (یقصد بأهل البدع، هو كل من التزم عقائد تخالف عقائد أهل السنة والجماعة، ويقصد بالعقائد ماهو مخالفة لأصول أهل السنة والجماعة، كأمثال المعتزلة والرافضة والأشاعرة والمرجئة، إلخ).

واتە: مەبەست بە ئەهلی بیدعە:هەرکەسێکە پەیوەست بێت بە بیروباوەڕێك کە پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت، وەمەبەستیش بە بیروباوەڕ ئەوەیە پێچەوانە بێت لەگەڵ بنچینەیەکی ئەهلی سوننە و جەماعە، وەکو موعتەزیلە و، ڕافیزە و،ئەشعەری و، مورجیئە....هتد .

وەهەروەها دەفەرمووێ:جیاوازی هەیە لە نێوان بیدعەچی و پیاوێك بیدعەی هەبێ: هەرچی بیدعەچییە:ئەوە ئەو کەسەیە کە پەیوەستە بە بیروباوەڕی ئەهلی بیدعە،کە پێچەوانەی بنچینەیەکی ئەهلی سوننە بێت، بەڵام ئەو کەسەی کە دەوترێت بیدعەی هەیە ، ئەوە کەسێکە کە لە ئەهلی سوننە و جەماعەیە، بنچینە و بیروباوەڕی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، بەڵام بیدعەیەکی ئەنجام داوە، وەکو زیندووکردنەوەی شەوی پازدەی مانگی شەعبان، یا وەکو بیدعەی بەنی ئومەییە کە وتاری جەژنیان پێش دەخست بەسەر نوێژ، یا بەردەوام نوێژ دواخستن بۆ کۆتایی کاتەکەی، یا وەکو داهێنانی زیکری دیاریکراو و هاوشێوەی ئەمانە،یاخود وەکو ئەو کەسەی سیفەتێك لە سیفاتەکانی خوا لە کاربخات و نەیسەلمێنێ بەبێ ئەوەی پەیوەست بێت بە

بنچینەی لەکارخستن لە سیفاتەکان یا هێندێکی، ئا ئەو جۆرە کەسانە پێیان ناوترێ بیدعەچی، بەڵکو دەوترێ ئەهلی سوننەیە و بیدعەیان تێدایە .

شێخ ناصر بن عبدالكريم العقل دەفەرمووێ:زاراوەی ئەهلی ئەهواء بە زۆری بۆ ئەو کەسە بەکاردێت کە پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت لە بنەمایەك یا زیاتر لە بنەماکانی دین، وەکو فیرقەکانی خەواریج و شیعە و قەدەرییە و مورجیئە و موعتەزیلە و جەهەمییە و ئەهلی کەلام و، سۆفییەکانی تەریقەت، یاخود ئەو تاکانەی کە دەردەچن لە بازنەی ئەهلی سوننە و جەماعە،کەواتە ئەهلی ئەهواء بریتیین لە ئەهلی تەفرەقە و بیدعە.

وەهەروەها ئەو فیرقانەش دەگرێتەوە کە دەرچووینە لە ئیسلام و دەدرێنە پاڵ ئیسلامیش، وەکو دووڕووو و فەلاسیفە و،باتنییە و، زندیقەکان و هاووێنەیان. (موقع الشيخ) .

تێبینی: لێرەدا هەڵەی ئەو مەخەلییانەمان بۆ ئاشکرا دەبێت ، کە زۆر جاران خەڵکی بەهۆی بیدعەی عەمەلی-وەکو:مەولود یا جۆرە زیکر و سەڵاواتێکی بیدعی-لە بازنەی ئەهلی سوننە دەبەنە دەرەوە و بە بیدعەچی لە قەڵەمیان دەدەن ئەوە لەکاتێکدا خۆشیان تووشی بیدعەی عەقیدەیی بووینە !!!

سێیەم: هەرکەسێك لەبەشێکی زۆر(جزئيات كثيرة)پێچەوانەی ئەهلی سوننە بێت، ئەوە جێگای بنچینەیەك دەگرێتەوە و، بەڵگەیە لەسەر فەساد و خەلەلی بنچینەیەك لە بیروباوەڕەکەیدا .

## سەلەفییەت مەنهەجی تێگەیشتن و خورەوشتە نەك مەنهەجی جوێن دان و ناکۆکی

پێم باش بوو لە بەشی پێنجەم و کۆتایی ئەم کتێبەدا بەشێك لەو نامیلکەیەی شەیخ ئەبو حەفصی جەزائیری وەربگێڕم کە بەناوی (السلفية منهج أفهام وأخلاق لا منهج سباب وشقاق)ە .

شەیخی بەڕێز دەڵێت: ئەمە هێندێك بنچینە و یاسای بەناو سەلەفییەکانە،بە گوێرەی ئاگاداری و سەرنجدانی من و جگە لە منیش لە جەزائیر، لەچەند خاڵێکدا کورتی دەکەمەوە بۆ ئەوەی ببێت بە ئامۆژگاری بۆ ئەو بەناو سەلەفییانە و لە خوا بترسن، وە هەروەها وەکو ئامۆژگارییەکیشە بۆ ئەو کەسەی کە توشی زماندرێژی ئەوانە بووە بە جوێن دان تاوەکو ئارامبگرێ .

١-ئەو کۆمەڵە تانەدان و کۆکردنەوەی هەڵەی پیاوچاکانیان کردووە بە دین و مەنهەج،لە کاتێکدا ئیمامی ئیبن و دەقیق لعید دەفەرمووێ: قسەگوتن بە موسڵمانان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ،لەناو خەڵکیدا دوو کۆمەڵ لەسەر لێواری ئاگری دۆزەخن:فەرموودە ناسەکان و دەسەڵاتدارەکان. ئیمامی زەهەبیش دەفەرمووێ:قسەکردن لەسەر ڕاویەکان پێویستی بە لە خواترسانێکی تەواو و، دووربونەوە لە هەواو ئارەزوو .

بۆیەش ئەم زانستە گەورەیە (علم الجرح والتعديل)چەندان یاسا و ڕێسای هەیە تاوەکو هەرکەسێك چۆنی بویٚ قسە دەربارەی غەیری خۆی نەکات .
بەڵام لەلای ئەم کۆمەڵە هەموویان خەریکی تانەو تەشەردانن لەخەڵکی و، لەسەر هەرکەسێك بیانەویٚ جێبەجێی دەکەن، بەبیٚ ئەوەی گەیشتبنە ئەو پلەیە و شیاوی ئەو کارە بن .

٢-بچوکەکان فێری جوێن دان و قسەگوتن بە بانگخوازان دەکەن، پێش ئەوەی فێری ڕوکنەکانی ئیمان و هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و بنچینەکانی خوڕەوشتیان بکەن، گەنجێك تازە خوا هیدایەتی داوە و دەستی کردووە بە دینداری هەر لەسەرەتاوە فێری ئەوەی دەکەن فلاٚنە کەس بیدعەچییە و ئەویتر گومڕایە .

٣-هەر کەسێك موافیق بێت لەگەڵیان پلەی بەرز دەکەنەوە، ئەگەر چی کەسێکی سەرەتاییش بێت، بەڵکو ئەگەر نەزانیش بێت، بۆیەش زۆرێك لەوانەی حەزیان لە ناوبانگە بەرەو لای ئەو کۆمەڵە دەچن .

٤-دەنگ دابڕین و قسەنەکردن(هەجر)وەکو چەکێك بەکاردێنن بۆ هەڕەشەکردن لە دژی موخالیفی خۆیان، منداڵێك هێشتا بالغ نەبووە کردوویانەتە تانەدەر و بڕیاردەر بەسەر خەڵکی بەوەی فلان ئەهلی سوننەیە و فلان ئەهلی بیدعەیە ، پاشان چەکەکەیان بۆ سەرخۆیان گەڕایەوە و کەوتنە تانەدان و تەبدیع کردن(بە بیدعەچیدانان)و هەجرکردنی یەکتری .

٥-یەکێك لە فێڵ و ساختەکارییەکانیان ئەوەیە هاتوون قسەکانی سەلەفی صالح دەربارەی ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە ئەهلی بیدعە وەکو جەهمی و موعتەزیلە و شیعەکانیان هێناوە و بەکاری دێنن دژی بانگخوازانی سوننەت .

٦-ئەوانە کاتێك کۆمەڵێك لە بانگخوازان و ئەهلی عیلمیان تەبدیع کرد بەبێ بیدعەیەکی ڕاستەقینە، دوای ئەوە پەنایان بردە بەر تاقیکردنەوەی خەڵکی بە دیاریکردنی هەڵوێستیان بەرامبەر بەو کەسەی کە تەبدیعیان کردووە، بۆیە هەرکەسێك قسەکەی ئەوان نەڵێت(واتە ئەو کەسەی ئەوان تەبدیعیان کردووە تەبدیعی نەکات)ئەوە لە سەلەفییەت دەری دەکەن و،ئەوەش قسەکەی ئەوان بڵێتەوە ئەوە سەلەفییە .

وە بەهۆی ئەم کارەشیانەوە وای لێهاتووە سەلەفییەت پێوەرێکی تایبەتی هەیە لەلای ئەو کۆمەڵە .

٧-هەرکەسێك لەگەڵ ئەوان نەبێت ئەوە لە گومانی ئەواندا دژی وانە، ئەمەش حیزبایەتییە بە پۆشاکێکی نوێوە .

٨-دۆستایەتی و دوژمنایەتییان لەسەر بنچینەی کەسەکان و ئەو مەنهەجەشە کە دراوەتە پاڵ شوێنکەوتراوەکانیان .

٩-دەمارگیری بۆ گەورەکانیان و بیروبۆچوونەکانیان لە حەق و ناحەقدا، تاوەکو دەربارەی یەکێك لە گەورەکانیان گوتیان:فڵان کەس خۆی بەڵگەیە جا چۆن بە بەڵگە دەوترێ بەڵگە بێنە !!!

١٠-حەق و ڕاستی بە پیاوانەوە دەناسن نەك بە بەڵگە، ئەگەر وتەیەکیان پیشان بدەی، یاخود هەڵوێستێکیان بۆ ڕوون بکەیتەوە نکوولی لێ دەکەن، بەڵام ئەگەر پێیت گوتن ئەوە فڵان کەس گوتویەتی، هەر ئەوکات هەڵوێستی خۆیان دەگۆڕن لە نکوولی کردنەوە بۆ قەبوڵکردن، لەبەر ئەوەی گەورەکەیان ئەو قسەیەی کردووە ، چەندان شت هەیە کە ئەوان نکووڵیان لێدەکرد، لەبەر ئەوەی لە کەسانێکەوە دەرچووبوو موخالیفی ئەوان بوون، بەڵام کاتێك لەلایەن ئەوانەوە دەرچوو وەریانگرت یەکێکیش لە نیشانەکانی ئەهلی باتڵ بریتییە لە ڕاڕایی لە هەڵوێستەکاندا .

١١-یەکێك لە بنچینە بۆگەنەکانیان وازهێنانە لە حەق، چونکە موخالیفی ئەوان دەیڵێت، یاخود دەیکات، بۆیە لەلای ئەوان بەڵگەی ڕاستییێتی بریتییە لە پێچەوانەکردنی موخالیف، وەکو ڕافیزەکان یەکێك لە بنچینەکانیان ئەوەیە دەڵێن: گەر لەکارەکانی ئێمەش حەقت نەناسی ئەوە پێچەوانەی ئەهلی سوننە بکە.

١٢-ئەنجامدانی ئیرهابی فیکری لە ئەنجامی بەکارهێنانی سیاسەتی شێواندن و بڵاوکردنەوەی شتی پڕوپووچ و درۆ لە نێو خەڵکی لە بەرامبەر هەرکەسێك کە بیەوێ پێچەوانەی ئەوان بجوڵێتەوە یا ڕەخنە بگرێ یاخود ئامۆژگارییان بکات، بۆیە فڕوفێڵ یەکێکە لە ئامرازەکانیان .

١٣-یەکێك لە شتە داهێنراوەکانیان:ئەوەی قسە نەکات لەسەر ئەو کەسەی کە ئەوان قسەیان دەربارەی کردووە ئەوە مورجیئەیە !!!

١٤-یەکێکی تر لە بنچینە بۆ گەنەکانیان گومانی خراپ بردنە بە موخالیف، کە ئەمەش وای لێکردوون پەنا ببەنە بەر جاسوسیکردن و بەدواداچوونی هەڵە و نووسینەوەی لە کاغەز و لاپەڕەکان، بۆ ئەوەی دوای ئەوە هەڵبستن بەهەڵمەتی ناوزڕاندن و ئاگادارکردنەوە، پاشانیش دەنگ دابڕین.

١٥-قسەی هەموو کەسێك وەردەگرن نەناسراو بێت یا فاسق بێت، ئەگەر لە بەرژەوەندی خۆیان دابێت ، بەڵام ئەگەر تۆ قسەیەکی بیستراو یان نوسراویان بۆ بێنیتەوە کە بەڵگەبێت لەسەریان ئەوە گومانی تێدا دروست دەکەن و دەڵێن فڵان کەس لاسایی دەنگەکەی کردۆتەوە یاخود جگە لەمەش لە قسەی پڕوپووچ ڕق و قینە چاوی سەر و دڵی کوێرکردوون، اللهم عفوك .

١٦-ئەوان ئەگەر فەتوای یەکێك لە زانایانیان بەدەست کەوت کە موافیقی هێندێك لەو قسانە بێت کە ئەوان دەیڵێن، ئەوە پێی دڵخۆش دەبن و خەڵکیشی پێوە پەیوەست دەکەن، بەڵام ئەگەر فەتوایەك دەرچوو پێچەوانەی بۆچوونی ئەوان بێت، هەر ئاوڕیشی لێنادەنەوە و دەڵێن ئێمە مولزەم نین پێوەی .

١٧-قسەی خراپ بە هێندێك لەو گەورە زانایانە دەڵێن کە موخالیفیانن،بەچەند وە سفێکی گەورە و ترسناك و خراپ کە بریتییە لە:فڵان زانا کۆمەڵەکان ناناسێت، یا فڵان لە مەنهەج تێنەگەیشتووە، یاخود فڵان تەکفیرییەکانی لەدەورە و یاری پێدەکەن .

١٨-لەگەڵ موخالیفی خۆیان لە بری ئەوەی ڕێگەی ئامۆژگاری و گفتوگۆی زانستی بەبەڵگەوە بگرنە بەر، هەوڵی ترساندنی کەسی موخالیف دەدەن بەچەند دەربڕین و وشەیەکی توند کە بەڵگەیە لەسەر ئیفلاس بوونیان لەبابەتی گفتوگۆکردن بەبەڵگەی شەرعی و ئەسەری سەلەفی .

١٩-هەوڵدەدەن پەناببەنە بەر گەورەترین فێڵ کە بریتییە لە هاندانی حاکم دژی موخالیف، ئەویش یا بەگەیاندنی زانیاری هەڵە دەربارەی موخالیف، یاخود بەبڵاوکردنەوەی ناو وناتۆرەی گەورە لەسەری، وەکو: تەکفیری، یا خەواریج،یا پشتگیری ئیرهاب دەکات، یاخود هانی ئیرهاب دەدات و،جگە لەمانەش لەو وشەو دەربڕینە هەڕەشەییەکان .

٢٠-یەکێکی تر لە بنچینەکانیان دەربارەی تەبدیع و گومڕاکردن: هەرکەسێك بیدعەیەك ئەنجام بدات یاخود ئەوان واگومان دەبەن کە بیدعەیە، ئەوە کەسێکی بیدعەچییە بەبێ ڕەچاوکردنی مەرج و ڕێگرەکان، نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو بەشێك لە زیادەڕەویان لەم بابەتەدا جاری وایە کەسی موخالیف تەبدیع دەکەن لەسەر کارێکی ئیجتیهادی .

٢١-یەکێکی تر لە بنچینەکانیان لە بابەتی تەبدیع:هەرکەسێك بیدعەیەك ئەنجام بدات، نەك هەر بە بیدعەچی دادەنرێ، بەڵکو هەموو قسەکانی بەفیڕۆ دەچێت حەق بێت یان ناحەق، ئینجا هاوار بۆ ئەوکەسەی قسەی ئەو کەسە بێنێتەوە کە ئەوان تەبدیعیان کردووە .

٢٢-دیسان یەکێکی تر لە بنچینەکانیان لەبابەتی تەبدیع ئەوەیە:ئەگەر بیدعەچی بە بیدعەچی دانەنێی ئەوە تۆش بیدعەچیت یا شلگیریت (إذا لم تبدع مبتدع فأنت مبتدع أو مميع)،کەواتە ئەوان وەکو خەواریجەکانی پێش خۆیانن، ئەگەر ئەو کەسەی کە لەلای ئەوان کافر بوو کافرت نەکردبا ئەوە تۆش کافر بووی.

٢٣-بڕینی دەقەکان و بە بەڵگەهێنانەوەی بەشێکی، جاچ بۆ وەڵامدانەوەی بێت یاخود بۆ بە بەڵگەهێنانەوە بێت .

٢٤-مەنهەجەکەیان دامەزراوە لەسەر ڕەخنەگرتن لە غەیری خۆیان و بەدواداچوونی هەڵەکان، کەواتە مەنهەحێکی سلبییە و، هەڵگرەکانیشی هێچیان پێ نییە بۆ بەخشین .

٢٥-مەنهەجیان کورتکردۆتەوە لە کتێبی ڕەد و ڕدوود(وەڵامدانەوە) .

٢٦-بێ گومان ئەم مەنهەجە سەیر و سەمەرەیە بویتە ڕێگر لە بەردەم زۆرێك لە گەنجان لەوەی ڕووبکەنە زانستی شەرعی، بە بەڵگەی ئەوەی کە زانستی شەرعی بەس نییە بۆ پەردەلادان لەسەر کەسی بیدعەچی، بۆیە پێویستە ڕووبکرێتە ئەو کتێبانەی کە ئەوان ناویان لێناوە (کتێبی مەنهەجی).هەتا هێندێکیان ئەم کتێبانەیان لەلا باشترە لە کتێبی تەوحید و عەقیدە، بەڵکو هێندێك کەسی کەم و بێ قیمەتیان ئەم کتێبانەیان پێ باشترە لە لەبەرکردنی کتێبی خوای گەورە .

٢٧-دەیان بینی لە هەموو خەڵك زیاتر گوماناوی و ڕاڕانە وە لەهەموو خەڵکی لاوازترن لە ڕووی زانست و یەقینەوە، ئەمەش کارێکە خۆیان لە دەروونی خۆیانەوە هەستی پێدەکەن و، خەڵکێکیش لە خۆیان ئەو شایەتییە دەدات .
لە کۆتاییدا:بەم جۆرە کەسانە دەڵێم کاتی ئەوە هاتووە کە چاوێك بەو ڕێگە و ڕێبازەتاندا بخشێننەوە کە پێچەوانەی مەنهەجی پێشەواکانە .
بەڕاستی بانگەوازتان پارچەپارچە کرد، بانگخوازەکانتان سەرقاڵکردووە بە هێندێك بابەتی داهێنراوەوە کە لە پێشەوایانەوە نەمان بیستووە، خەڵکتان دوورخستەوە لە زانست و کردەوە بردتانن بەرەو نەزانین و موناقەشە، دەرگای

غەیبەت و نەمیمەتان کردۆتەوە، خراپەکاریتان لە نێو برواداران بڵاوکردۆتەوە، بونەتە ڕێگر لە بەردەم دینی خوا بۆ کەسێك کە پێشتر دینی خوای نەناسیبێ، ئەگەر وشەیەکی حەقتان پیبێت زۆری ناحەقتان داوەتە پاڵی .

ئێوەش بۆتان ڕوون بۆوە ئەم مەنهەجە چەندە ترسناکە، کەوا زۆرێکیش لە گەنجان وەریانگرتووە، زمان درێژی دەکەنە سەر غەیری خۆیان بەبێ حەق و، تەبدیعی موخالیفی خۆیان دەکەن بەبێ ڕێسایەکی دیاریکراو و بەبێ بەڵگە،وە ئەمانە هیچ چارەسەرێك سوودیان پێ ناگەیێنێ، تەنها ئەوەنەبێ خۆیان فێری زانست و زانیاری بکەن و بە ئەدەبی ئەو زانستە خۆیان پەروەردە بکەن، پاشانیش خوا کێی بوێ ڕێنمایی دەکات .

لە ڕاستیدا چەند هۆکارێك هاندەربوون بۆ نووسینی ئەم چەند دێرە :

١-بڵاوبوونەوەی ئەم مەنهەجە سەیر و سەمەرە(نامۆ)یە لەسەر حیسابی مەنهەجی سەلەفی .

٢-دوورکەوتنەوەی زۆرێك لە خەڵکی عەوام لە مەنهەجی سەلەفی بەهۆی ئەم مەنهەجە سەیر و سەمەرەیەوە .

٣-قسەکردنی زۆرێك لە ئەهلی ئەهواء و بیدەع لەسەر مەنهەجی سەلەفی، بەهۆی لادانەکانی ئەم مەنهەجە سەیر وسەمەرەیەوە .

٤-دووری گەنجەکان لە زانستی شەرعی .

٥-بوێری زۆرێك لە گەنجە سەرەتاییەكان لە قسەكردن لەسەر هێندێك بانگخواز و زانایان .

داوا دەكەین لە خوای گەورە كە بمانپارێزی لە فیتنە و هەواو ئارەزوو، وە دوورمانخاتەوە لە ستەم و گومڕایی و نەزانین و خۆبەگەورەزانینێك كە كەڕ و كویرمان بكات .

داواكارم لە خوای گەورە شارەزامان بكات لەو ڕێبازە پیرۆزە و،بەردەوامبمان بكات لەسەری تا ئەو كاتە پێی دەگەینەوە،هەر ئەویش بەتوانایە لەسەر ئەو كارە و، یارمەتی دەر و سەرخەرە .

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.